

# هەنگ

# HENG

ژمارە ١٠٣
شوباتی ٢٠٠٥





لەم هەنگەدا

# زانای ژیرو پاشای توندو تیژ

(سەربووردەیەکی کۆنە)

گێڕانەوەو سیناریۆ: سۆران عیزەدین فەیزی
نیگار: ئاریان عەبدولخالیق سەرسام




نرخی (٣٠٠) دینارە

گۆڤارێکی مانگانەی منداڵانە
وەزارەتی ڕۆشنبیری هەرێمی کوردستان
دەریدەکات

ژمارە
١٠٣
شوبات
٢٠٠٥



# هەنگ

خاوەنی ئیمتیاز
**سامی شۆڕش**
وەزیری ڕۆشنبیری

سەرنووسەر
**حەمەساڵح فەرهادی**

بەڕێوەبەری نووسین
**گوڵەر حەبیب سیامەنسووری**

بەڕێوەبەری هونەری
**عەبدولقادر عەلی مەردان**

پیت چنین و فەرزی ڕەنگەکان:
**ئاسۆ خالید**

ناونیشان:
کوردستان - هەولێر   شەقامی هەڵەبجە
باڵەخانەی (کۆشکی هونەر) نهۆمی یەکەم
ت/ بەداله ٢١٣٢٩٥٧ - ٢٢٣٢٩٥٨

**گۆڤاری هەنگ لەسەر سایتی**
**www.heng.150m.com**
**بخوێنەوە**
**مۆبایل/** ٤٤٩٥٦٠٨

چاپ:
بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی ڕۆشنبیری - هەولێر
چاپکردنی بەرگ: چاپخانەی وەزارەتی کشتوکاڵ

HENG
*A children Monthly Magazine*
*Issued by*
*The Ministry of Culture - Kurdistan Region*

بەرگی یەکەم: عادیل زرار
بەرگی دووەم: ئاریان سەرسام

## چۆلەکە

**هۆنراوەی:**
**نەوزاد ڕەفعەت**



- دابەگیان کە باوکیان ناشتم
چۆلەکەکان بۆی نەگریان؟
بۆچی نەهاتنە سەر گۆڕی و
پەڕوباڵیان هەڵنەوەران؟
- ڕۆڵە باوکت
چۆلەکەی دەدایە بەر بەرد
ڕاوی دەنان
بێچروەکانی دەگرتن و
هێلانەو ماڵی تێکدەدان

(لەدیوانی شاعیر - پەرییەکان هەڵ دەفڕێنمەوە - وەرگیراوە)■

# دڵی دایک

ئامادەکردن و سیناریۆ: گوڵەر حەبیب سیامەنسووری
نیگار: مریەم عەبدوڵڵا



ژمارە ١٠٣
شوبات ٢٠٠٥

# شێرە بەفرینەکەی کوردستان

نووسینی: پەخشان حەمەمیرزا
نیگار: دلشاد عەلی

ئازاد کوڕە کوردێک بوو لەیەکێک لە گوندەکانی قەدپاڵی شاخەکانی کوردستانی خوارووی دەژیا، بەیانییەکیان لەخەو هەڵستاو بینی گوندەکەیان یەک پارچە تارای سپیی پۆشیوە، بەڵام ئەوەی زیاتر بووە هۆی مایەی سەرسوڕمانی ئازاد ئەوەبوو شێرەبەفرینەیەک لە لاپاڵی چیاکەی گوندەکەیاندا زۆر جوان و سپی وەستابوو.

ئازاد خێرا لێی چووە پێش و لێی پرسی:

- ها شێرەبەفرینە لە کوێوە هاتووی؟

شێرە بەفرینە گوتی: من سێ تۆپەڵە بەفر بووم، کاتێک چەند منداڵێکی چاوگەش لەسەر شاخەکانی (جوودی و کەلیخان و هەڵگورد)دا یارییان دەکرد من گلۆر بوومەوە، گلۆر... گلۆر... تا بەردەمی منداڵانی ئێوە نەوەستام.

- کەواتە تۆ تۆپەڵە بەفری دەستی منداڵانی کوردستانی، بەدیاری بۆ ئێمەیان ناردووی.

بەڵێ ئازاد گیان، هاتووم بەناوی ئەوانەوە پیرۆزبایی ئازادیتان لێ بکەم.

هەر بۆیە ئازادی ژیکەڵەو وریاش خێرا گێزەرێک و دەستەسرێک و ئاڵایەکی کوردستانی بەدیاری پێشکەش بە شێرەبەفرینەکە کرد.



# گوندی (دووبرا)

نووسینی: شەوبۆ یەحیا خدر
نیگار: لاوین دارا



دوو برای هەتیوی بێ دایک لەیەکێک لەو گوندانەی کوردستاندا هەبوون، کە هەر لەزووەوە دایک باوکیان مردبوون و خزمەکانیان گەورەیان کردبوون، گەورەکەیان ناوی داراو بچووکەکەیان ناوی ئازاد بوو.

دارا تابلێی منداڵێکی هێمن و گوێرایەڵ و لەسەرخۆو وریاو مەند بوو، بەڵام ئازاد کەمێک بزۆزو لاسارو توندو لەسەر بوو. دارا هەرچی دەکرد ئازادی بۆ نەدەهاتە سەر ڕاستەڕێ، هەمیشە



ئامۆژگاری دەکردو لە هەڵەوچەوتی و لاسارییەکانی دەیگێڕایەوەو بەهانایەوە دەهات.

دارا بەدەست ئازادەوە وەزاڵە هاتبوو، هەرچەندی دەکردو هەوڵی دەدا چارەیەکی بۆ نەدەدۆزرایەوە، تاوای لێهات دارا بەئازاد بڵێ لەمەودوا برای ئەو نابێ و برایەتیی ناکات.

ئەم قسەیە کاری لە بیرو هۆش و مێشکی ئازاد کرد، کەوتە بیرو لێکدانەوەو لەبەرچاوگرتنی کارە نابەجێیەکانی خۆی، تارۆژێکی گەرمی هاوین لەقەراغ گۆمێکی مەندو ڕاوەستاوی رووبارێکدا خۆیان ڕووت کردەوە تا مەلە بکەن، دارا زۆر ڕێنمایی ئازادی کرد کە نەچێتە قووڵایی گۆمەکەوە، چونکە مەلەوانێکی باش نییەو لەوانەیە ماندووبێت و خۆی پێ دەرباز نەکرێ..

زۆری پێ نەچوو شڵپەشڵپی ئاوی گۆمەکە ئاوڕی بەدارا دایەوە، کەسەیری کرد وا ئازاد پەلەقاژەی دەربازبوونییەتی، هەر نقوم دەبێت و دێتە دەرەوەو هاوارییەتی..

دارا دەستوبرد خۆی گەیاندێ و لە تاڵووکەمەرگی دەرهێناو هێنایەوە دەرێ و وردە وردە کەوتە ئاو دەرهێنان لەزگی و هەناسەپێدانی ئازاد.

کەئازاد هاتەوە سەرخۆو زانی ئەگەر برا دڵسۆزەکەی نەبووایە ئێستا خنکابوو، بەڵێنی بەدارای برای دا کەئیدی لەمەودوا هەرگیز لەقسەی دەرنەچێت و بە ئامۆژگارییەکانی ئەوو کەسانی لەخۆی گەورەو زاناتریش بکات. بۆیە لە دواییدا ئەو دووبرایە بوونە نموونەی خوو و ڕەوشت و ئاکاری بەرزو گوندەکەشیان بەناوی ئەو دووبرایەوە ناونا بە (گوندی دووبرا).



# گۆرانیی دایکم

نووسینی: تەلال حەسەن
و. لەعەرەبییەوە:
عەزیز ڕەشید هەریری
نیگار: د. قانیعە گەلالی

چەند ڕۆژێک بوو بێچووە ورچەکە لەدارستانەکەدا دەگەڕاو دەسووڕایەوە، بێ ئەوەی بۆ تاکە چرکەیەکیش دایکی لەخەیاڵیدا بزر بێت.

ڕۆژێکیان هێندە ماندوو و شەکەت و برسی بوو، گەڕایەوە لانەکەی خۆی، لەپڕ کەروێشکێکی بینی دەسکە گێزەرێکی پێ بوو یەکسەر پەلاماری داو دەستەکانی خۆی لەملی گیرکردن، کەروێشکەکە زۆری لێ پاڕایەوەو گەرەکی بوو خۆی لەچنگی ڕزگاربکات، دەپاڕایەوەو پێی دەگوت: ورچەگیان ئازادم بکە، بەزەییت پێمدا بێتەوەو بهێڵە بچمە نێو بێچووەکانم و بگەڕێمەوە لانەکەی خۆم.

بێچووە ورچەکە گوتی: ئەی نازانی من برسیمە، برسی؟!

کەروێشک: بەڵام ورچە خنجیلانە بێچووەکانی منیش ئێستا برسییانەو چاوەڕوانی منن بچمەوە ئەم گێزەرانەیان بۆ بەرم.

کەروێشکەکە کەوتە دڵەڕاوکێ و تابڵێی نیگەران بووبوو، بەڵام دانی بەخۆیداگرت و نەیهێشت نیگەرانییەکەی بەسەریدا زاڵ بێت و لەبەرخۆیەوە گوتی: هەی بێچووە ورچی بەد ڕەوشت مەرج بێ نەهێڵم ئەو فێڵانەی تۆ بەسەرمندا زاڵ بن.

کەروێشکەکە دەیزانی بێچووە ورچەکە کاتی خەوتنییەتی، بۆیە بیری لەوە کردەوە کە لەئامێزیی بگرێ و شیری بداتێ تاخەوی لێدەکەوێت.

زۆری نەبرد بێچووە ورچ هەردوو دەستی، کە لەملی کەروێشکەکەیدا ئاڵاندبوون خاوبوونەوە، بەڵام هێشتا نەخەوتبوو، گوتی: ئای کە خۆشە، دایکیشم ڕێک ئاوا لە ئامێزیی دەگرتم و شیری دەدامێ!

کەروێشکەکە لەبەرخۆیەوە گوتی:



دیارە تا گۆرانیی بۆ نەڵێم ناخەوێت.
ئێتر دەستی کردە

گۆرانی و گوتی: (بێچووە ورچە ئازیزەکەم بخەوە، خۆشەویستەکەم بخەوە).

بێچووە ورچەکە لەپڕ لەئامێزی کەروێشکەکە وەدەرکەوت و بەدەنگێکی بەرز گوتی: ئای خوایە! ئەمەیان هەمان ئەو گۆرانییەیە کەپێش خەوتنم دایکم بۆی دەگوتم.

کەروێشکەکەش بەسەرسامییەوە گوتی ئەوە بەڕاستیتە؟

ئینجا بێچووە ورچەکە چوارمەشقی لێی دانیشت و هەردوو چاوی پڕبوون لەفرمێسک و گوتی: ئای دادە کەروێشک گیان، خۆزگە دەتزانی بۆ ئەم گۆرانییە چەند بەپەرۆشم؟! لەو ڕۆژەوە دایکم لێ بزر بووە نەگوێم لەدەنگی ئەو بووەو نە ئەم گۆرانییەشم بیستووە، خۆزگە جارێکی دیکەش بۆت دەگوتمەوە، چونکە بۆن و سۆزی دایکم لەتۆدا بەدی دەکەم.

کەروێشکەکە سەیرێکی بێچووە ورچەکەی کردەوەو بەدەنگێکی نزم دەستی بە گۆرانییەکە کردەوە: (بێچووە ورچە ئازیزەکەم بخەوە.. بخەوە خۆشەویستەکەم بخەوە).

بێچووە ورچەکە چاوەکانی لێک نان و خەو بردییەوە، لەبەر خۆشییەوە نەرم نەرم دەیگوت: دە توخوا دایە گۆرانیم بۆ بڵێ، دەمێکە دەنگتم نەبیستووە، ئەی ئەوە نییە لەتۆیان دوورخستوومەتەوە، دەبا گوێم لەو دەنگە خۆشەت بێت، قەی چییە، باوەکو لەنێو قەفەزیشدابم.

بێچووە ورچەکە بۆ تاوێک بی دەنگ بوو، کاتێکیش کە دەنگی گۆرانییەکە نەما، لەپڕ ڕاچەنی! کەچاوی کردەوەو لەدەوروبەری خۆی ڕوانی جگە لەو دەسکە گێزەرەی کەلەسەر زەوی کەوتبوو هیچ شتێکی دیکەی نەدی.

ئیتر بۆ ڕۆژی دووەم کەکەروێشکەکە لەلانەی خۆی وەدەرکەوت بۆ ئەوەی هەندێک گێزەرو خواردن بۆ بێچووەکانی پەیدابکات، لەبەردەمی لانەکەیدا هەمان دەسکە گێزەرەکەی خۆی و هەندێک گەڵا کەلەمیشی بینی، کەلای بێچووە ورچەکە جێی هێشتبوو. هەر ئەوکاتە کەروێشکەکە دڵسۆزی و وەفاداریی بێچووە ورچەکەی بیرکەوتەوە، کەڕۆژی پێشتر شیری دابوویەو گۆرانی بۆ گوتبوو.



# خۆر

ئا: تاهیر عوسمان
نیگار:
پەخشان گەلالی



خۆر لە تەنێکی خڕی زەبەلاحی گڕگرتوو پێکهاتووەو بارستاییەکەی نزیکەی ٩٩٫٨٦٪ی تێکڕای بارستایی کۆمەڵەی خۆر پێک دەهێنێ.

پلەی گەرمیی خۆر بەپێی قووڵاییەکەی دەگۆڕێت، پلەی گەرما لەسەر ڕووی دەرەوەی نزیکەی (٦٠٠٠) پلەی سەدی دەبێت، بەڵام پلەی گەرمای ناوەوەی دەگاتە (٢٠) ملیۆن پلە.

بەرزیی خۆر دەگاتە دەیان هەزار کیلۆمەترو هەمیشەو بە بەردەوامی گڕێکی گەورە دەردەکات، زۆرجار ئەم گڕە لە شێوەی ڕەشەبایەکی کوشندەو بەهێز لەسەر هەندێک لەبەشەکانی ڕووی خۆردا دەردەکەوێ، ئەو گەرماییەی کە لەخۆر دەردەچێت و ڕوو لەبۆشایی دەرەوەی دەکات گەلێک زۆرە، چونکە تەنیا دوو بەش لە ملیۆنێک بەشی ئەو گەرماییە دەگاتە زەوی و ئەو بەشە زۆر کەمەش بەسە بۆ ئەوەی دانیشتووانی سەر ڕووی زەوی لەسایەیدا بحەوێنەوەو بەهۆیەوە ژیان لەسەر زەویدا ببەنەسەر.

سەرچاوە: سندباد بغداد. العدد/ ١٥، ٢٠٠٣.

ژمارە ١٠٣
شوبات ٢٠٠٥

# چەند زانیارییەک لەبارەی مانگەوە

و. لەعەرەبییەوە: سروە مستەفا مەحموود
نیگار: هەزار سەلاح

* چیای وا لەسەر ڕووی مانگ هەیە کە بەرزییەکەی دەگاتە هەزاران مەتر، بەرزترینیشیان چیای (دارڤێل)ە کە دەگاتە (٧٦٠٠) مەتر

* ئەگەر لەسەر ڕووی زەوییەوە تەماشای مانگ بکەین، دەبینین شوێنە شاخاوییەکان ڕووناک دیارن، چونکە تیشکی خۆریان بەردەکەوێت، بەڵام شوێنە نزمەکان بەتاریکی دەردەکەون.

* تەنیا یەک ڕووی مانگ لەئێمەوە دیارە، ئەویش لەبەر ئەوەی کە خێرایی

*

# حەمەی هوشیار

بیرۆکەو نیگار: ئیبراهیم ساری
ئا: کەژاڵ عەبدولجەبار





خولخواردنەوەی مانگ بە دەوری خۆیدا یەکسانە بەخێرایی خولخواردنەوەی مانگ بەدەوری زەویدا، ئەمەش وای کردووە تەنیا یەک لا یان نیوەی مانگ بەرانبەر زەوی بێت. بەو نیوەیەش کە بەرانبەر زەوی نییە دەگوترێت (ڕووی شاراوەی مانگ).

* ئەو بەردانەی کە زاناکان لەسەر ڕووی مانگ بۆ لێکۆڵینەوە دەیانهێننەوە، لەناو کیسەی پلاستیکیی پاکژکراو دادەنرێن و دەخرێنە سندووقی تایبەتییەوە، تا لەسەر زەوی لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە ئەنجام بدرێت.

* سەر ڕووی مانگ هیچ شوێنەوارێکی ئاوی تێدانییە.

سەرچاوە: مجلة (العربي) العدد ١٩٩ - حزيران ١٩٧٥

# ڕێزگرتن تەنیا بە باڵای مرۆڤدا نەبڕاوە

و. لەعەرەبییەوە: د. ئازاد مستەفا مەحموود
نیگار: ساڵح مەهدی



برادەرێکم ڕووداوێکی بۆ گێڕامەوە کە لەیەکێک لەباخچە گشتییەکانی ڤیەننای پایتەختی نەمسادا بەسەری هاتبوو، گوتی: باخچەکە وا دەهاتە بەرچاوان وەکو بڵێی خانوویەکی تایبەتیی کۆتران بێت و ناسین و تەبایی و کەوی بوونیان بەئاشکرا پێوە دیاربوو.

دەمدیتن دەفڕین و بەسەرشانی گەلێک کەسەوە، کەدەستیان بۆ درێژ کردبوون و لەپیان پڕ دان بوو، دەنیشتنەوەو دەنووکیان لەدانەکە دەدا، ئەو دانەش فرۆشیاری گەڕۆک هەر لەناو باخچەکە بەخەڵکەکەیان دەفرۆشت.

منیش چاوم لەوان کردو دەستم درێژ کردو دیتم چەند کۆترێک بەسەر شانمەوە هەڵنیشتنەوەو پڕیان دایە لەپی دەستم بۆ دان، بەڵام زۆری نەبرد بەدڵشکاوی هەڵگەڕانەوەو فڕین و لێم دوورکەوتنەوە، چونکە لەپم بەتاڵ بوو لە دان و منیش بەمەبەستی گاڵتە پێکردن وامکرد بەدیمەنی کۆترە تووڕەو دڵشکاوەکان دڵخۆش بووم و هێندەی پێنەچوو

# گورگ

ئا: هەوراز تاهیر
نیگار: عەلی دەروێش

گورگ گیانلەبەرێکی بەهێزو چوست و چالاکە، لەشی ڕێک و پەلەکانی بەهێزن، لەشی بەتووک داپۆشراوە، پارێزگاریی دەکات لەسەرما.

گورگ گیانلەبەرێکی گۆشتخۆرو شیردەرە، لەتوخمی سەگەو لەشێوەشدا لەودەچێت، قاچەکانی بەهێزن و بەنینۆکی ڕەق و تیژ کۆتاییان دێت کە لەڕۆیشتندا یارمەتیی دەدات.

گورگ بەکۆمەڵ و بەتاک دەژین، لە کاتی برسییەتیدا لەشێوەی کۆمەڵ (گەلەگورگ) هێرش دەبەنە سەر گوندو ئاوایی و هەر مەڕو ماڵاتێکیان دەستکەوێت ملی دەشکێنن و دەیخۆن.





بەپێکەنینەوە تێم تەقاند، بەڵام یەکێک لەوانەی لەو ناوە لێم نزیک بوون بەشداریی پێکەنینەکەی نەکردم.

چەند خولەکێکی نەبرد یەکێک لەپیاوانی پۆلیس هات و کارتێکی لەدەفتەرێکی نێو دەستی پڕ کردەوەو لێم نزیک کەوتەوەو هاتە بەردەمم و دەستی بەگفتوگۆ کرد لەگەڵمداو گوتی: گەورەم وا دیارە تۆ بیانیت، ئێمە لەو وڵاتەدا ڕقمان لەدرۆکردن دەبێتەوە گەرچی بۆ گاڵتەش بێت، هەروەها ڕقمان لە هەڵخەڵەتاندن دەبێتەوە ئەگەرچی لەگەڵ گیانلەبەریش بێت، ئەم کۆترانەش لە ئەمینی و دڵسۆزی و ڕاستی ڕاهاتوون و خدوویان بەخەڵکەکە گرتووە، ئێمەش نامانەوێ بڕواییان پێمان نەمێنێ و لەدەست دەربچن و ئەم باخچەیە بەجێ بهێڵن بۆیە سیستەمەکانی ئەم باخچەیە، کە دەبینی لەملاوە هەڵواسراوە، بڕیاری سزادانی هەر کەسێک دەدات کە ڕەفتاری لەشێوەی ڕەفتاری جەنابتان بێت لەگەڵ کۆترەکاندا.

بەمجۆرە لەکاتێکدا پۆلیسەکە کۆتایی بەنووسینی کارتەکە هێنا، دوانەکەشی لەگەڵمدا دوایی پێ هێنا، کارتەکەی دادەستم کەسەیرم کرد بەگوێرەی وی پێ بژاردن (غرامە)ێک بوو کە بەپێی سیستەمەکانی باخچە دەبووایە بیدەم.

سەرچاوە: گۆڤاری (العربي الصغير) پاشکۆی گۆڤاری (العربي) ژمارە (١٨١) ساڵی ١٩٧٥.



گورگ لەوڵاتی ئێمەدا زۆرە، زۆر کەس ڕاویان دەکەن و دەیانکوژن، چونکە گیانلەبەرێکی زیانبەخشە



# لاواندنەوەی دایک بۆ کۆرپە شیرینەکەی لەهۆنراوەی فۆلکلۆری کوردیدا
## (٤)

ئا: عەبدوڵڵا فەتاح نیگار: دارا محەمەد عەلی

### • ددان هاتن

کە منداڵ بۆ یەکەمجار دوو ددانی لەپێشەوە دێت، دایکی بەسۆزی تایبەتیی خۆیەوە دەڵێ:

ددان هـــاتـــن دوو و ســێ
نـــانــی بـڕی لـەکـــاســێ
دایکی دەڵـێ قـــەد کـــەسێ
بـاوکی دەڵـێ مـــــەترسێ

### • خۆ بەقوربان کردن

دایک ڕۆژی چەندین جار خۆی بەقوربانی منداڵەکەی دەکات، هەروەک لەم چەند هۆنراوەیەدا ڕەنگ دەدەنەوە:



قوربانت بم، قوربانت بم
وەکو شاهان دیوانت بم

یان: لەبەرت بمرم لەبەرکێ
لەبەر تاقانەی دایکێ

یان: قوربانت بم چاو شەهێنە
دەسکی خەنجەرت قەزوێنە
بەگوفتی خۆت بمدوێنە

یان: حەوتت ببێ بەقوربان
چواری پیرو سێی جوان
لەجوولەکەو لە دیان

یان: بەقوربانت بم، بەقوربانەوە
بەگەورەگەورەی ئاغاکانەوە
بەکێخواو مەلای پشدەرییانەوە

ژمارە ١٠٣
شوبات ٢٠٠٥



# هاوڕێی خراپ

ئامادەکردنی:
محەمەد کەریم نانەوا
نیگار: ساڵح مەهدی



باخەوانێک هەبوو، باخێکی خۆش و بزنێک و مەیموونێکی بەدفەڕی هەبوو.

کچێکی جوان و قشتیلانەش هەبوو ناوی (مەرزیە)بوو.. ڕۆژێکیان مەرزیەخان لەدەمەدەمی چێشتەنگاودا نوردوویەک نان و جامیلکەیەک ماستی بۆ باوکی هێنابوو و لەبەردەم ساردداوەکە دایابوو.

مەیموون چاوی بەماست کەوت نەوس گرتی و لیکاو بە لالغاوەیدا چۆڕاوگەی بەست، خۆی پێ نەگیراو چوو هەتا تێربوو ماستی خوارد، پاشان ترسی باخەوانی کەوتە دڵی، گوتی: ئێستا بزانێ من ماستەکەم خواردووە دارکاریم دەکات.



بۆیە هەڵسا چوو ئەو ماستەی بەبنی جامیلکەکەوە مابووەوە بەلەپی دەستی هەمووی لەملووزی بزنی هاوڕێی هەڵسوی، پاشان سەرکەوتە بان بنەدارێکی بەرزو خۆی مات کرد.

باخەوان کاتی پشوودان و نانخواردن دەستی لەکار هەڵگرت و بۆلای سارداوەکە ڕۆیشت، بینی ماستەکە خوراوە، چاوی گێڕا کەسێک لەو ناوە دیارنەبوو، سەری لەم کارە سوڕما.

مەیموونەکە لەسەر بنەدارەکە بە ویقەویق و هەڵبەزو دابەز باخەوانی ئاگادارکردەوەو تێی گەیاند کە بزن ماستەکەی خواردووە.. باخەوان تەماشای بزنەکەی کرد بینی لمووزی لەماست وەردراوە، زۆر تووڕەبوو و چاوی تاریک داهات، شووڕە دارێکی هەڵگرتەوەو کەوتە گیانی بزنە بەستەزمانەکە، هەرچەند شووڕی لێدەدا بزنی بەستەزمان زگی دەگەیاندە ئەرزو قاڕەقاڕی ڕۆژەڕێیەک دەڕۆیشت بەڵام بێ هوودە بوو کەس نەبوو فریای بکەوێت.

ژماره ١٠٣
شوبات ٢٠٠٥

# سکاڵای ژیر

هۆنراوەی: محەمەد سەعید زەنگەنە
نیگار: ئاریان عەبدولخالیق سەرسام

سکاڵای شەنگ و ناسک
سکاڵای بێچووە ئاسک
سکاڵای گوڵی چواڵە
هێشتا زارۆکی ماڵە
ئەم گلۆوکە هەنارە
تەمەنی پێنج بەهارە
باڵای سێ بست و نیوە
پرچی قەت نەبڕیوە
چاوی وەک ترێ ڕەشە
ڕوومەتی جوان و گەشە
زاری خونچیلانەیە
کەپووی خنجیلانەیە
قەدی شلک و باریکە
شەکرە سێوەو فەریکە
ژیکەلەیە خوێن گەرمە
لە هاتوچۆیا نەرمە
ڕووی ڕوونە وەک ئاوێنە
هەموو گیانی خاوێنە



ژمارە ١٠٣
شوبات ٢٠٠٥

# پشیلە

هۆنراوەی: پەپوولە - بۆکان
نیگار: دڵشاد عەلی

پشە پشە پشیلە
چاو جوان و زەردیلە
لەناو ماڵ و کۆڵانا
لەسەر بان و داڵانا
هەردەم ملۆمۆیەتی
بیری زگی خۆیەتی
دەستی کەوێ تۆزقاڵێ
گۆشتی مریشکی ماڵێ
یان لە گۆشەو کەنارێ
بدزێ جووجک بەجارێ
یان بچێتە سەر حەوزان
دەربێنێ ماسیی جوان جوان
یان لە کەلێن و قوژبن
برفێنێ مشکی خرپن
ئەی پشیلەی موو بەلەک
دەست هەڵگرە لە کەلەک
ئەی تالانچیی بێ سیفەت
هیچی تر مەبە چاوبەست





ئەم چووزەرە ڕێواسە
گەر پێت خۆشە بیناسە
خشتەی لێکدان سەرپاکی
لەبەرییەتی بە چاکی
شیعری پاراوی کوردی
بۆت دەخوێنێ بەوردی
مەتەڵیش دادەهێنێ
چیرۆک هەر جوان دەخوێنێ
لە شت زۆر ڕادەمێنێ
لە قسە دانامێنێ
لەوێنەو نیگارکێشان
لەنوکتەو شت هەڵهێنان
بلیمەتە بلیمەت
بلیمەتێ بەهیمەت
لای خەڵکی زۆر پەسندە
جار جار پێی دەڵێن خەندە
ئەم چرۆ ئێسک سووکە
لەئازادیی (کەرکووک)ە

# دیمانەیەک لەگەڵ هونەرمەند سەلاح محەمەد

ئا: ئاسوودە عەبدوڵلازادە
پەیامنێری گۆڤاری هەنگ



**ماموستا سەلاح محەمەد یەکێکە لەو دەنگە دیارانەی کە بەسیمای (مام عەولا) بواری هونەری منداڵانی جوانترو دەوڵەمەندتر کردووە.. لەبەسەرکردنەوەی ئەمجارەی گۆڤاری (هەنگ)دا چۆلەکە ئاسا فڕین و لە سووچێکی سەندیکای هونەرمەنداندا (هەنگ) باوەشی بە مام عەولادا کردو لەنزیکەوە لێی پرسی:**

**پ١: منداڵ چۆن پێناسە دەکەیت؟**

و: منداڵ ئەو ڕۆح سووکە خنجیلانەیە کە هەموو مرۆڤێک لەبەرانبەریدا چۆک دادەداو خۆشەویستی و سۆزو هەستی دەجووڵێنێ.

**پ٢: باشە منداڵییەتیی مام عەولا چۆن بوو؟**

و: منداڵییەتیی مام عەولا زۆر چەتوون و دژوار بوو، لەبیرم دێ قوتابیی سەرەتایی بووم، هاوین بوو پێڵاوم لەپێدا نەبوو، یاریگەو باخچەی گشتی و ئامێری یاریکردن بۆ منداڵان هەر نەبوو، تەلەفزیۆن و گۆڤارو ڕۆژنامەی منداڵانمان بەچاو نەدەبینی، یاریگەمان کۆڵان و پەنادیواران بوو، زۆر جاریش شەوانە بە یارییە کوردەوارییەکان شەومان بەڕێ دەکرد، هەژاریمان زۆر پێوە دیاربوو، لەشارەکەماندا تەنیا یەک قوتابخانەی سەرەتایی هەبوو، دوایی کرا بەدووان.

**پ٣: کەی و بۆچی دنیای منداڵانت هەڵبژارد؟**

و: زۆر جار لەدەزگاکانی ڕاگەیاندندا بەرگوێم دەکەوت و لەگۆڤارو ڕۆژنامەکاندا دەکەوتە بەرچاوم کە لەبواری هونەرەوە هیچ بۆ منداڵی کورد نەکراوە، منیش بەئەرکم زانی ڕوو لەو جیهانە پاک و بێگەردە بکەم و بەپێی توانا خزمەتێک پێشکەش بەمنداڵی کورد بکەم.

**پ٤: یادگارییە شیرین و تاڵەکانت لەگەڵ منداڵاندا چین؟**

## وای بۆ دەچم هەموو منداڵێک مام عەولای خۆشدەوێ

و: لەوەتەی چوومەتە نێو دنیای منداڵانەوە هیچ یادگارییەکی تاڵم لەگەڵ منداڵاندا نییە، هەموو یادگارییەکانم خۆشن و خۆم وای بۆ دەچم هەموو منداڵێک مام عەولای خۆشدەوێ.

**پ٥: کلیپی (دێوەرە) چ کاریگەرییەکی لەبەرەوپێشبردنی هونەری گۆرانی و مۆسیقای منداڵاندا هەبوو لە کوردستاندا؟**

و: کلیپی (دێوەرە) یادەوەرییەکی منداڵیی خۆمە کە بە چاوی خۆم دێوەرەم دیبوو.. دێ بەدێ دەگەڕاو شیرینی بەسەر منداڵاندا دەبەخشییەوە. کاریگەریشی لەسەر هونەری منداڵان؛ ئەوە دەبێ هونەرمەندان و جەماوەرو منداڵان خۆیان هەڵی بسەنگێنن.



**پ٦: ئایا فۆلکلۆری کوردی سەرچاوەی تەقینەوەی کانیلەی هونەریی بەڕێزتان نییە؟**

و: لای من کەلتووری نەتەوەکەمان زۆر گرنگەو بایەخیشی پێ دەدەم، زۆربەی کلیپەکانم یارییە کوردەوارییەکان و فۆلکلۆرە ڕەسەنەکانن.
داواش دەکەم هەرکەسێک یارییەکی کوردەواری یان گۆرانییەکی تایبەت بەمنداڵان دەزانێ بۆم ڕەوانە بکات تا بتوانم بەشێوازێکی جوان زیندووی بکەمەوەو پێشکەشی منداڵانی کوردی بکەم.

**پ٧: بەرهەمی داهاتووی مام عەولا بۆ منداڵانی کوردستان چییە؟**

و: چەند بەرهەمێکی تازەم ئامادەیە بۆ تۆمارکردن، هەندێکیشیان ئاوازەکەیان تەواوە بەڵام کاریان ماوە، پەنا بەخوا گشتیان بەئەنجام دەگەیەنم.

**پ٨: دوا وتەی مام عەولا چییە؟**

هێڤیدارم گۆڤاری (هەنگ)و گشت گۆڤارەکانی دیکەی تایبەت بەمنداڵان لەگەشەکردن دابن بۆ خزمەتی منداڵی کورد، گلەییەکی بچووکیشم لەگۆڤارەکەتان هەیە ئەگەر لێم وەربگرن، بەر لەچەند ساڵێک هەڵبەستێکم پێشکەش بە گۆڤارەکەتان کرد بەناوی (مامۆستا)، بەڵام بەداخەوە لیژنەی هەڵسەنگاندن لەسەریان نووسیبوو ئەم شیعرە منداڵانە نییەو بەکەڵکی بڵاوکردنەوە نایەت، ڕاستە من هۆزانڤان نیم، بەڵام جارجارە شیعر بۆ منداڵان دەنووسم، بۆیە بڕیارم دا ئاوازی بۆ دابنێم و بیکەم بە کلیپ و بڵاوی بکەمەوە، هەر واشم کرد، سیناریۆیەکم بۆ نووسی و لە T.V کوردستانی کەناڵی ئاسمانیدا تۆمارم کرد، جارجارە پەخش دەکرێت.
دواجار تکا لە هەموو دەزگاو ڕێکخراوەکانی ناو هەرێمی کوردستان دەکەم کە منداڵ پشتگوێ نەخەن و گرنگییان پێ بدەن.

# سیر

ئا: ژاڵە سەباح حەبیب
نیگار: دارا محەمەد عەلی

لەسەرچاوە مێژووییەکاندا هاتووە کە لە سەردەمی فیرعەونییەکاندا سیر وەک خۆراک دەدرایە ئەو کرێکارانەی کە قووچەک (هەرەم)ەکانی میسریان دروست دەکرد، بۆ ئەوەی وزە ببەخشێتە لەشیان بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە گەورەیە.



ئێستاش سیر ڕووەکێکی باوە، بەکاڵی و بەکوڵاوی دەخورێت و بۆ لەشی مرۆڤ زۆر بەسوودە، چونکە زۆر کانزای گرنگی وەک ئاسن و فۆسفۆرو خوێ و چەوری و ترشیی تێدایە. جگە لەوەش سیر بۆ چارەسەرکردنی چەندین نەخۆشی بەسوودە، وەک کۆخەو هەڵامەت و ئازارەکانی قوڕگ. هەروەها سیر لەپیشەسازیی جۆرەها داوودەرمانیش بەکار دەهێنرێت.

## بۆچی کەنغەر گیرفانی هەیە؟

ئا: م. ئاکۆ عەبدوڵڵا
نیگار: ساڵح مەهدی



کەنغەری مێیینە گیرفانی لە ژێرەوەی سینەیدا هەیە تاکو بەچکەکەی تێدا هەڵبگرێت، چونکە بێچووی تازە لەدایکبووی ئەم گیانلەبەرە پێچەوانەی هەموو بێچوویەکی ترە، بێ تواناو بێ جووڵەو ڕووت و قووتەو ناتوانێت لەهیچ شوێنێکدا بژی و بمێنێتەوە جگە لەو گیرفانە نەبێت کە شوێنێکی خۆش و ئارامە

# ڕادیۆ



منداڵە خۆشەویستەکان:
ڕادیۆ یەکێکە لە هۆیەکانی ڕاگەیاندن و ڕۆژانە خەڵکێکی زۆر گوێی لێ دەگرن و بەگۆرانی و هەواڵ و دەنگوباس و بەرنامە خۆشەکانی ئاشنا دەبن.
ئەو ئامێرە بۆ یەکەمین جار لەلایەن زانای ئەڵمانی (مارکۆنی)یەوە دروست کراوە. ئەو ئامێرە بەشێوەیەکی ئاسان دەگوازرێتەوەو خەڵک دەتوانن لە هەموو شوێنێکدا سوودی لێ وەربگرن.
ئازیزەکان:
ئێوەی خنجیلانەو ئێسک سووک دەتوانن لەڕێگەی ئەو ئامێرە زانستییە پێشکەوتووەوە گوێ لە بەرنامەکانی منداڵان بگرن بۆئەوەی زانیاریی بەسوودی لێ فێربن، چونکە بە گوێگرتن لەڕادیۆ ئاسۆی بیرتان فراوان دەبێت و ڕۆژانە زانیاریی تازە فێر دەبن، بەڵام بەمەرجێک وانەکانی خوێندنتان فەرامۆش نەکەن.

ئا: محەمەد سەعید کوردە
نیگار: دلشاد عەلی



بۆی. بەمجۆرە تا ماوەی (٦) مانگ تێیدا دەگوزەرێنێت و گەشە دەکات. ئەوسا لە دایکییەوە فێری بازدان و ڕۆیشتن دەبێت.

سەرچاوە: بنک المعلومات للأطفال - دار الفکر للنشر والتوزیع - عمان جزء ٢٣.



# منداڵان و وەرزی شانۆ

ئا: ئاسوودە عەبدوڵڵازادە
پەیامنێری گۆڤاری هەنگ

**لەم ماوەیەدا بەڕێوەبەرایەتی چالاکیی قوتابخانەکان لەبەڕێوەبەرایەتی گشتیی پەروەردەی هەولێر وەرزێکی شانۆیی لە هۆڵی بەڕێوەبەرایەتی چالاکیی قوتابخانەکان سازدا کە بۆ ماوەی دوو ڕۆژ بەردەوام بوو و تێیدا چەند شانۆگەرییەک نمایش کرا.**

ئێمە وەکو گۆڤاری (هەنگ) لە هۆڵی چالاکییەکاندا ئامادەبووین و لەگەڵ بەشداربووانی شانۆگەرییەکان کەوتینە گفتوگۆ.

سەرەتا **مامۆستا کرمانج مستەفا** ئامادەکارو دەرهێنەری شانۆگەریی (برادەر) گوتی: شانۆی برادەر باسی دوو برادەر دەکات کە لەکاتی تەنگانەدا یەکتر لەیاد ناکەن و لەقسەی دایک و باوکیان دەرناچن و کاروباری ڕۆژانەیان بە بەرنامە بەڕێوە دەبەن.

**قوتابی ئازاد فەیسەڵ** پۆلی چوارەمی سەرەتایی گوتی: من وەک ئەکتەر لەشانۆگەریی (برادەر)دا هەستم بەخۆشی کرد، بەتایبەتی کە خۆم لەنێو ئەو هەموو منداڵانەدا دۆزییەوە.

هاوڕێتان **ئەگرین ڕەشید** گوتی: وەکو کچە کوردێکی بچکۆڵە توانیم لە شانۆگەریی (برادەر)دا ڕۆڵی دایک ببینم و پێم خۆشە لە داهاتوودا ببمە دایکێکی میهرەبان و خۆشەویست.

**مامۆستا سەردار عومەر** لە دەوری (کوکو) لەشانۆی بووکەڵەدا گوتی: کارکردن لەگەڵ منداڵاندا هەست کردنە بەمنداڵی بوون و بۆ خۆشت منداڵ دەبییەوە.



**تریفە نەریمان** قوتابیی پۆلی چوارەم لەقوتابخانەی وەفایی تێکەڵاو گوتی:
من خۆشحاڵم کە توانیم وەکو منداڵێک بەشداری لەشانۆگەریی (خەونەکانم) بکەم.
**ڕێزان عەبدولمەجید** قوتابیی پۆلی چوارەمی سەرەتایی لەقوتابخانەی وەفایی گوتی: زۆر سوپاسی مامۆستا نەوزادی حاجی شووشە دەکەم کە زۆر یارمەتیی داین و لەم شانۆگەرییەدا فێری ئەوە بووین چۆن ئاڵاو قوتابخانەو خوێندنمان خۆش بوێ.
**مامۆستا نەوزادی حاجی شووشە** وەکو نووسەرو دەرهێنەری شانۆگەریی (خەونەکانم) گوتی: ئێمە بەهۆی هونەر دەتوانین خۆمان بەجیهان بناسێنین.
شایانی باسە قوتابییان لەشانۆگەریی (خەونەکانم)دا هەریەکەیان باسی خەونەکانی خۆیان دەکەن، دانا کە یەکێکە لەئەکتەرەکانی ئەو شانۆگەرییە، دەڵێ: من ئەو خەونەم دێتە دی.
منداڵەکان دەڵێن: کام خەون؟
دانا دەڵێ: ئەو خەونەی ڕۆژێک لەڕۆژان وڵاتێکی سەربەخۆم هەبێت و ئاڵاشم لە هەموو جیهاندا بشەکێتەوە.
دواجار یەکەیەکەی ئەکتەرەکان ئاڵای کوردستانیان ماچ کرد.
لەکاتی گەڕانەوەشماندا منداڵێکی ژیکەلانە هاتەلامان و گوتی: حەز دەکەم قسە بۆ (هەنگ)ی خۆشەویست بکەم، چونکە لەلام زۆر جوانە. ئەو منداڵەش ناوی (ئاراخان)بوو.



ژماره ١٠٣
شوبات ٢٠٠٥

# ئارەزووەکانی مێرووڵەیەک

ئا: لەفۆلکلۆرەوە: عەباس سلێمان سمایل
نیگار: دڵشاد عەلی

ڕۆژێک لەڕۆژان مێرووڵەیەک لەکاتی کۆکردنەوەی دەنکە جۆیان، گۆسکەیەکی پڕ لە هەنگوینی بینی کە لەسەر بەردێکی بڵند دانرابوو. مێرووڵەکە لیکاو لەدەمییەوە هاتە خوارەوەو نەیتوانی بیگاتێ.. هەرچەند هەوڵی دا بێ سوود بوو، ناچار بوو هەر یەکێک بەوێدا بهاتایە پێی دەگوت: ئەوەی لەسەر ئەو گۆسکە هەنگوینەم دابنێ، دەنکە جۆیەکی دەدەمێ.

کاتێک مێرووڵەیەکی باڵدار بەوێدا تێپەڕی و گوێی لەدەنگی مێرووڵەکە بوو پێی گوت: ئەگەر بچیتە سەر ئەم گۆسکەیە زەنگەسوورە دەتخوات.

مێرووڵەکە گوتی: لەزەنگە سوورە ناترسم.

مێرووڵە باڵدارەکە گوتی: دەترسم لەهەنگوین گیر بخۆی و نەتوانی خۆت ڕزگار بکەیت.

مێرووڵە: ئەگەر هەنگوین دەست و پێی بگرتایە، ئەوا کەس بەدوای هەنگویندا نەدەگەڕا.

مێرووڵەی باڵدار: تۆ نازانی، ئەگەر بەگوێی من دەکەی وازی لێ بێنە، وامن بەجێت دێڵم و باش بزانە من خاوەن ئەزموونم.

مێرووڵەکە دووبارە دەستی بەهاوارو تکاکردن کردەوە، ئەمجارە مەگەزێک بەوێدا تێپەڕی و مێرووڵەکەی گەیاندە سەر گۆسکە هەنگوینەکە، ئەویش زۆر سوپاسی مەگەزەکەی کردو زۆر دڵخۆش بوو، کەویستی هەنگوینەکە بخوات کەوتە ناوی و هەنگوینەکە دەست و پێی گرت، ئەویش هەرچەندە تەکانی دا خۆی، نەیتوانی خۆی ڕزگار بکات، ئەمجارە بە ناچاری هاواری کرد: ئەوەی لەم هەنگوینە ڕزگارم بکات، دوو دەنکە جۆی دەدەمێ!

کاتێک مێرووڵەی باڵدار لەگەشتەکەی گەڕایەوەو مێرووڵەکەی بەمجۆرە بینی دڵی پێ سووتاو ڕزگاری کردو پێی گوت: بەختت زۆر باش بوو کە زوو گەڕامەوە، جارێکی دیکە بەرلەوەی تووشی گرفت ببیت گوێ لەئامۆژگاری بگرەو یارمەتیی مەگەزبشت نەوێت.





# بەرهەمی ئازیزان



## چەتر

هۆنراوەی: شاکار جۆشان مەجید
تەمەن: ١١ ساڵ
نیگار: پەخشان گەلالی

ئەی چەترەکەی لەبەر باران
من هەر تۆم ویست لەڕێگاو بان

ئەی چەتر تۆ خۆشەویستی
بۆ وەرزی زستان پێویستی

ئەتۆی هەردەم لەبەر باران
تاکە هاوڕێی وەرزی زستان

خۆشەویستی لەناو ماڵان
لای گەورەکان تا منداڵان



**ژیار دیار بەرزنجی**
پۆلی یەکەمی سەرەتایی
قوتابخانەی (دڵی کوردستان) هەولێر





**نازە دڵشاد محیەدین**
پۆلی شەشەمی سەرەتایی





**محەمەد دڵشاد محیەدین**
پۆلی چوارەمی سەرەتایی







# کاتێکی خۆش



٢٦

ژمارە ١٠٣

شوبات ٢٠٠٥


## ڕێگە نیشاندان

ئا: هالە سەڵاح عەلی

ڕێگە بەم سوارئەسپە نیشان بدە بۆ ئەوەی بگاتە دەرگای ماڵەوەیان.



## دروستکردنی وێنەی کەڵەشێر لەکاتی دان خواردندا

و. لەفارسییەوە:
هودا جەلالەدین

١- سەرەتا سێگۆشەیەکی سەرەوژێری هەرسێ لا یەکسان بکێشە وەکو وێنەی ژمارە (١).

٢- پاشان بەپێی ڕیزی ژمارەی وێنەکان هەنگاوەکانی تر تەواو بکە.

٣- دوای تەواوبوون بە جوانی وێنەکە ڕەنگ بکە.

سەرچاوە: کتێبی (خود آموز طراحی مهگل) نووسینی عباس دهقانیان.




## میوەیەک و پیتەکان

ئا: تارا

میوەیەکی بەتام و سوودمەندە لە (٧) پیت پێکهاتووە:

پیتی ١ + ٦ + ٢ = ساڵی ڕابردوو.

پیتی ٣ + ٦ + ٧ = پێچەوانەی شیرین.

پیتی ٥ + ٤ + ٧ + ٦ = شوێنەوارێکی شاری هەولێرە

پیتی ٥ + ٦ + ١ = خواردنی تێدا دەخورێت.

پیتی ١ + ٣ + ٢ = زیاتر.

ئەم میوەیە چییە؟

شیکار: